# لادانە سێکسیەکان

# Sexual Deviations

ئا: فازیل هیمەت
مامۆستای پەیمانگەی تەکنیکی سلەیمانی

لێکۆڵینەوە لەسەر لادانە سێکسیەکان بەپێی بنچینەیەك دەبێت کەوای دابنێین شێوازێکی تایبەتی سێکسی بۆ هەر کەسێك لەنێرو مێ هەیە، ئەویش ژیانی سێکسی بایۆلۆژیە.

بەلام چەند شێوازی سێکسی هەیە لەرووی پەیوەندیکردنەوە کەدوورە لەلێکدانەوەو بۆ چوونە سەرەکیەکە واتە بارە بایۆلۆژیەکەی، کە لەو کاتەدا بەلادان دەژمێردرێت، ئەمەش کەس نازانێت هۆکارەکانی ئەم لادانە چی بوون، هەر چەندە لەژیانی ئاژەلاندا هەندێك لادانی سێکسی دەبینرێت. بەلام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت. کە هۆکارەکانی لەمرۆڤ دا هۆکاری بایۆلۆژین، لەگەل ئەوەشدا لەو بڕوایەدان کە لادانە سێکسی یەکان لە مرۆڤدا هۆکارەکانی ژینگەیی " دەوروبەر" و شارستانیەتیە، و کاردەکاتە سەر واقعی بایۆلۆژی ژیانی سێکسی.

کەسی دوورکەوتوو لەرەفتاری سێکسی وەکو دەزانرێت بە" شاز دەگمەن" دادەنرێت. ئەم لادانەش بەچەند شێوەیەك ناوی لێنراوە و تا بۆوو قەدەغە کراوە.

"کەسی لادەر Sexual Pervert" ئەوەی نەشێو مەبەستیان بێت دژی کراوە ووتراوە و بگرە سزاش دراوە بەلام بەبەردەوامی لادان لەگەل پەرەگرتن و قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤدا هاتووەو لەهەموو سەردەمەکاندا و لەسەردەمی ئێستاشدا پەیرەو کردنی ژمارەیەکی زۆری مرۆڤ ئەو راستیە دەسەلمێنێت. هەر چەندە شێوەو جۆری لادانی دیکە سەری هەلداوە بەلام بابەتەکە ئەو توندو تیژیەی جارانی نەماوەو ئەو فشارە زۆرەی کۆمەلگەش لەسەر ئەو کەسانە کەمتر بۆتەوە، چونکە کۆمەل هۆشیار بۆتەوە لەوەی کە مرۆڤ لەو شێوە سروشتیەی یان کۆمەلایەتیەی هەیەتی دەگۆرێت و ئارەزووی گۆرانی هەیە، ئەمە لەکاتێکدا دەتوانین بلێین لادان ئەوەیە کە کەسێك لەسەر بیرو بۆچوونی تۆ ناجولێتەوە سەرەرای ئەوەی کە بۆ هەموو لایەك روون بۆتەوە کە کۆمەلگە بێ لادان و شزوز نابێت تاکەکانی کۆمەلیش ناتوانن بەتەواوی پابەندی داب و نەریتی کۆمەلایەتی کۆمەلگا بن لێرەوە دەگەینە ئەوەی لادان بریتیە لەسەر پێچی کردنی داب و نەریتی کۆمەلایەتی ، جاران بەلادانی سێکسیان دەووت" شزوزی سێکسی بەلام لەئاکامی پێشکەوتن دا ئەو جۆرە ناونانە گۆرا لەبری ئەو زاراوەیە زاراوەی " لادانی سێکسی Sex Deviation" دانرا، کە جیاوازی نێوانیان بریتیە لە جیاوازی نێوان دەرچوون لەشتێك و دوورکەوتنەوە لێی.

لێرەدا دەتوانین لادانی سێکسی بەپێی دووبنچینەی فیکری بکەین بەدوو بەشەوە:-

١- لادانێك لەپراکتیزەکردنی بارە سروشتیەکەی سێکس وەك خۆی دەیەوێت و پێویست دەکات ووومارەسە بکرێت، بەو پێناسەیە هەرچی شێوازێکی دیکەیە بریتی دەبێت لەلادانی سێکسی.

٢- لادانێك بەپێی بیرو بۆچوونی کۆمەڵایەتیو ئایینی، واتە هەر دەرچونێك لەبەرنامەی ئایینیو کۆمەڵایەتی بەلادان دەژمێردێت. کە ئەو ئایین و کۆمەڵگەیە شێوازێکیان بەراست و دروست داناو ئەوەش بوو بەیاساو نەریتێکی سەپاو و چەسپاو.

لەوانەیە پرسیارێك بێتە پێشەوەو بڵێت، ئایا مەرجە هەموو لادانێکی سێکسی لە هەموو کۆمەڵگایەك دا وەك یەك تەماشا بکرێت؟ لەوەڵامدا دەتوانین بڵێین رەنگە ئەوەی لای ئێمە بە شزوز و لادانی سێکسی دادەنرێت، لەکۆمەڵگەیەکی دیکەدا ژیانێکی سێکسی سروشتییان ئاسایی کۆمەڵگەو ژیارێکی دیکە بێت.

بەڵام ئەمرۆ زانست و پێشکەوتنی بواری زانیاریو سێکسزانی ئەو شێوازانەی پۆلێن کردووە کە بە لادان دەژمێردرێن، واتە لەرووی هەموو کۆمەڵگایەکەوە وەك یەکە، لەلایەکی دیکەشەوە هەندێك پێی وانییە لادانی سێکسی هەبێت هەموو ئەو بارو شێوازانە بەکارێکی سێکسی سروشتی دادەنێ، تەنانەت مافی مرۆڤی ئەمرۆ لەجیهاندا بەتایبەتی لەهەندێ وڵاتی رۆژئاوادا رێگەی بۆ زۆرو بابەت و دیاردەی وەها خۆش کردووە، دیاردەی لادانی سێکسی هەیە، بەڵام رێگەی پێ دراوەو مافی هەر جۆرە رەفتارێکی سێکسی پێ بەخشیون کە خۆیان چۆنیان دەوێ، بەڵام ئەو هەموو رەفتارانە هەمووی لای کۆمەڵگەی رۆژهەڵاتی رەت دەکرێتەوە، و لەهەمان کاتیشدا بەلادانێکی ئاشکراو تەواوی دادەنێن.

### هەمە چەشنەیی سێکسی یان هەمە جۆری

Sexual Variation

هەمەچەشنیو جیاوازییەکان لەرووی پراکتیزەکردنی سێکسەوە خۆی لەخۆیدا لەلادانی سێکسی دەچێ، یەکێك لەدیاردەکانی ئەم سەردەمە زۆربوونی دیاردەی جۆراو جۆری هەمەچەشنی پەیوەندییە سێکسییەکانە. کە ئەم بابەتەش شتێکی نوێ نییە بەنیسبەت زانستی سێکسەوە. بەڵام پەیڕەوکردنی لەم چەرخەدا زۆرتر بووە وەك لەسەردەمەکانی تر ئەگەر هەر چۆنێکیش بێت هەروەها زۆربەی ئەو کەسانەی ئارەزووی ئەم جۆرە دیاردەیە دەکەن بریتین لە پیاوان و کەمێکیش لەئافرەتان بەتایبەتی لەژیارەکانی رۆژئاوادا. ئەم دیاردەیەش وا دادەنرێت کە پێویستیە کە بۆ چێژ وەرگرتن، لەلایەکی تریشەوە زۆر زەحمەتە بتوانین بگەینە ئەو هۆکارەی کە ئەم دیاردە هەمە چەشنە سێکسییەی لێوە هاتووە. یان دەتوانین بڵێین هەموو ئەو پەیوەندیو دیاردە جۆراو جۆرەو هەمە چەشنانە بۆ لەسێکس دا پەرە دەگرن. کەلەوانەیە هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆی نەبێت لەهۆی ئەوەی کە مرۆڤ ئارەزووی جۆراو جۆری " تنوع" دەکات لەبابەتەکانی جل و بەرگ و خواردن وماڵو خانووە ..هتد.

کە دەشێ بڵێین لەوانەیە لەبابەتێکی یان شێوازێکی یەك جۆری بەردەوام بێزار بێت.

هۆکارەکانی جۆراو جۆر هەرچیەك بێت. بەڵام توێژەرەوەکان لەسێ خاڵی جۆراو جۆری سێکس دا کۆکن:-

یەکەم:- هیچ سەرچاوەیەکی بایۆلۆژی نییە ئەوە لێکبداتەوە چونکە پەیوەندییەك نییە لە نێوان ئەم دیاردەو فاکتەرە زگماکی یان هۆرمۆنی کە بتوانن بوونی بسەلمێنن.

دووەم:- رەگ و ریشەی دیاردەی " هەمە چەشنی" جۆراو جۆری سێکسی بۆ سەردەمی منداڵی دەگەڕێتەوە لەدوای ئەوە بەهۆی فێربوون و لاسایی کردنەوە گەشەدەکات.

سێیەم:- زۆربەی زۆری ئەوانەی کە ئەم دیاردەی جۆراو جۆرە پەیڕەو دەکەن بریتین لە نێرینە، پێویستە لەسەر مرۆڤ ئەو دوو لێکدانەوەیە رێك بخات یان جۆراو جۆرێك وەربگرێت، کەواتە شتێك نامێنێت بەلادانی سێکسی دابنێین.

لەگەڵ ئەوانەی کە دەرچوون لەباری دیاریکراوو راهاتووی گونجاوی رەفتاری سێکسی بە لادان دەزانن، کە چاك دەزانین دکتۆرێکیش ناتوانێت هیچ هاوسەنگییەك لەنێوان ئەو دوو بۆچوونەدا بگونجێنێت، چونکە هیچ پێوەرێکی گونجاوو جێگیر نییە بۆ پیدانی رەفتاری سێکسی مرۆڤ.

ئەوەی کە باس کرا تەنها وەك دەروازەیەك بوو بۆچوونە ناو بابەتی لادانی سێکسییەوە هەروەها لەوانەیشە بمانگەیەنێتە ئەوەی کەلادانی سێکسی ئاکامێکی سروشتییە یان کۆمەڵایەتییە.

### هۆکارەکانی لادانی سێکسی

لەوانەیە کارێکی زۆر گران بێت کە تەنها هۆکارێك بۆ یەك باری لادان دیاری بکرێت، چونکە هەر دیاردەو لادانێکی سێکسی بەچەند هۆکارێکی جیاوازو کاریگەر دروست دەبێت وەك پێشتر ئاماژەمان بەچەند راستییەکدا کە لێرەدا دەتوانین لادەرەکەو پەروەردەی ژیانیو ژینگە کۆمەڵایەتیەکەی و توانا سێکسییە دەستەبەر بووەکانی لەئاکامی کاریگەری و کارلێکی ئەو هۆکارانەوە بەرجەستە بووە ئەو هۆکارانە رۆڵێکی بەرچاوو کاریگەریان هەیە لەدروست بوون و سەرهەڵدانی لادانی سێکسیدا. هەر چەندە هەتاکو ئێستا لەسەر بابەت و کێشەی لادانی سێکسی بیرو بۆچوونی زۆر هەیە، چونکە یەکێك لەو کێشانەی هاتۆتە بەردەم ئەوانەی کە پێدانێك بۆ لادانی سێکسی دابنێن، ئەوەیە کە دەبێت ئەوە دیاری بکەن کە کام بارە سروشتییەو کام بارە ناسروشتیو بەلادان لەقەڵەم دەدرێت....
چونکە لێکدانەوەکانیش بەپێی بیرو چەمکی کۆمەڵایەتیو

ئایینی‌و زانستی دەگۆڕێت. بۆنموونە هەر جۆرە پەیوەندی‌یەکی سێکسی دوور لەو بارە بڵاوەی لەکۆمەڵگادا باوەو پیادە دەکرێت لە رووی کۆمەڵایەتیەوە بەلادان و نامۆ لێك دەدرێتەوە، هەروەها لەرووی ئایینیشەوە ئەوەی دیاری کردووە و لەبەرنامەکانی‌دا هاتووە دەبێت بەو رێگەو پەیڕەو وبەرنامەیە بێت، ئەگەر نا بەلادانی رەوشتی و سێکسیش لێك دەدرێتەوە.

بەهەرحاڵ ئەمانەی خوارەوە چەند خاڵێکن دەتوانین هۆکارەکانی دروست بووونی لادانی سێکسی لەسەر دیاری بکرێت سەرەڕای ئەوانەی باس کرا و زیادبوونی رۆشنایی و زانیاری زیاتر بۆ سەر ئەو هۆکارانە.

یەکەم:- پێویستی تێرکردنی سێکسی هەر کاتێك بەهۆی هۆکارێك یا چەند هۆکارێك، بەشێوەیەکی سروشتی یان دەست کرد ببێتە هۆی رێگرتنی لەتێربوونی " رەزامەندی" سێکسی. ئەوا دەبێتە هۆی توندو تیژی هەڵچوون و تێکچوونی سۆزی سێکسی بۆ هاوسەنگی ئەو"بارە" پێویستی‌یە سێکسی‌یە تێکچووە، بەهەر شێوەیەك بێت. بۆ نموونە پەنا بردنە بەر چەند شێوازێکی رەفتاری سێکسی وەك دەسپەڕ و سێکسی هاورەگەز" الجنسیة المثلیة" وەك نێربازی‌و سێکسی ئاژەڵی" الجنسیة الحیوانیة" و سێکس لەگەڵ منداڵداو سێکسی تابۆ " محارم"و چەند لادانێکی دیکە کە زۆربەی زۆری ئەم لادانانە بەدەستەبەرکردنی تێربوونێکی سروشتی سێکسی کۆتاییان دێت.

**دووەم:- جۆراو جۆر و دۆزینەوە**

سەرەرای ئەوەی کە هیچ جیاوازی‌یەکی ئەوتۆ نی‌یە لەنێوان مومارەسەی سێکسی سروشتی‌و ممارەسەی سێکسی جۆراو جۆر یان لادانەدا کەزۆرجار کەسێك لەسەر شێوازێکی سێکسی تایبەت راهاتووە، بەبێ ئەوەی بزانێت ئەم شێوازە سروشتی‌یە یان نا. بەڵام کاتێك ئەو کەسە دەبینێت رەنگە لای وا بێت لادانە.

هەروەها لەوانەشە ئەو مومارەسەکردنی کەسێکی دیکەی بەلاوە لادان بێت و خۆی بەراست بزانێ.

**سێیەم:-" فێربوون و چەسپاو" راهاتن یان خووگرتن"**

زانایان رەفتاری سێکسی وا لێکدەدەنەوە لەئاکامی کردارێکدا دەبێت کەلە کەشێکی ناسروشتی‌بەیەك گەیشتندا دروست دەبێت کە رەفتاری سێکسی لەسەر شێوازێك خۆی رادەگرێت زۆر زەحمەتە وازی لێ بهێنێت.

زۆر لە توێژەرەوەکان لادان بۆ " خووگرتن" تطبع"ەکەی" پاڤلۆڤ" دەگێرنەوە دۆزیوێتیەوە. نمونەی ئەوە کە" ماجۆری Magurie" و ئەوانی دی بۆ لێکدانەوەی روودانی لادان لێکی دەدەنەوە. کەبەپێ‌ی ئەو لێکدانەوەیە منداڵ لەگەڵ هۆکارو بارە هەرەمەکیەکاندا لەبەر یەك کەوتندایە، کەدەبێتە وورووژاندنی سێکسی، ئەمەش لەپێش ماوەیەکی دوورو درێژدا روودەدات، کەلەئەنجامی دابرانێك و دوور لەسێکس لەگەڵ رەگەزی بەرامبەردا دروست دەبێت یان پەیوەندی‌یەکی سێکسی لەگەڵیدا.

ماجۆری‌و هاورێکانی لەو بڕوایەدان کە فێربوون لەدوای ئەم تاقیکردنەوە سێکسی‌یە دەبێت بە بەشێك لەخەیاڵی دەسپەڕ کە پارێزگاری لە هاوسەنگی‌یەکی ووردی نێوان هۆکاری وورووژێنەرو ساتی ئۆرگازمی رابردوودا دەکات وە دووبارە کردنەوەی دەسپەڕ لەگەڵ ئەو خەیاڵەدا ووردە ووردە بەرەو بارێکی جۆراو جۆری دەبات چونکە ئەو چێژو ئۆرگازمەی جارانی ناداتی‌و کەمتر دەیوروژێنێت، ئەم لێکدانەوەیە بۆ هۆکاری لادان زیاتر مەبەستی ئەو لادانانەیە کە لەنێو جیهانی نێردا زیاترە، وەك لەمێیینە، کە ئەم بیرۆکە پشتگیریەکی چاکە بۆ لێکدانەوەی سەرهەڵدانی لادان.

**چوارەم:- گەشەنەکردنی سێکسی**

بریتی‌یە لە تیۆرێکی فرۆید کە تیۆری" السببیة التحلیلیة" " شیکارە هۆکار" بەو پێ‌یە لادان و شزوز شی دەکاتەوە. کە دەڵێت رەگەزی مرۆڤ لەسەر ووزەیەکی سێکسی " لیبدۆ=

Libido" دەژی. کەلەو بڕوایەدایە" شزوز" لەرابردووی هەموو کەسێکدا هەیە. لە تێڕوانینی فرۆیدەوە منداڵ ئارەزوویەکی سێکسی هەمە لایەنەو لادانی هەیە، کە منداڵ چێژی سێکسی لەچەند سەرچاوەو چەند شێوازێکی مومارەسەکردن وەردەگرێت. کە فرۆید پێی وایە لادانی سێکسی بارێکی گەورەکراوو تەواوکردنی ژیانی سێکسی خاڵییە، بەڵام ئایا بۆچی لادان لە ژیانی هەندێك کەسدا روونادات، فرۆید ئەمیش لەسەر ئەو بنچینەیە لێکدەداتەوە کە گەشەی سێکسی بەشێوازە سروشتییەکەی لەمناڵییەوە تا گەورەبوونیلەسەر خاڵی گەشەکردن دەوەستێت.

کە ئەم خاڵی گەشەکردنە شێوازێکی سروشتی وەردەگرێت و گەرانەوە" نکوص" بۆ سەر خولی پێشووتری گەشەکردن. لەسەری جێگیر دەبێت: وە یەکێك لەو بیرۆکە " تیۆری" یە شیکردنەوەکانی لادانی سێکسی بریتییە لە تیۆری " فرانك بێتش" ساڵی ١٩٧٧ بەپێی ئەم تیۆرە. مومارەسەکردنی سێکسی سروشتی لەسەر وورووژاندنی هاوبەشی نێوان دوو کەس بەندە. کە هەریەکەیان پشت بەهەستی ئەوی دی دەبەستێت، بەڵام لەباری لاداندان لادەر بەدەنگەوە هاتنی لایەنی دووەمی بەلاوە گرنگ نییە چونکە یەك لایەنە بەوورژاندن دەگات، واتە لادەر بەتەنها بە وروژاندنی سێکسی خۆی ئەنجام دەدا دوور لە هەر کارتێکردنێکی بەرامبەرەکەی بەرای "فرانك" لادان بەئاسانی روو دەدات چونکەکەسی لادەر نایەوێت لە هیچ هاوبەشێك نزیك ببێتەوەو هاوکاری هەستی بکات.

**پێنجەم: دوو رەگەزی / " نێرە مووك" / ثنائية الجنس/.**

بەپێ ئەم تیۆرە لادان بەبارێکی سروشتی بایۆلۆژی نێرەمووك دادەنێت بەمانایەکی دی مرۆڤ هەر لەسەرەتای دروستبونیەوە واتە " قۆناغی کۆرپەلە" بریتییە لە تێکەڵەیەکی دوو رەگەزی. هەندێکی نێرینەو هەندێکی دیکەی مێیینەنە. بەڵام رێڕەوی کۆتایی بەرەو هاو رەگەز یان بەرامبەر دەڕوات.

وە لادانی سێکسی نێرینە" نێربازی" لەمێیینەنەشدا " پانۆکێ" ئەمەش هاوشانی تیۆرەکەی دی دەڕوات کە دەڵێت: منداڵ لەدایك بوونیەوە لەرووی بایۆلۆژیەوە لەبارێکی لۆژیکیی دووانە دەروونی" نفسية ثنائية"دایە.

بەڵام ئارەزووی بێ لایەنی " جیا خوازی" یارمەتیدەرە بۆ گەشەکردن و بەردوام بوونی شێوازی سێکسی تایبەت، یان مومارەسەکردنی رەفتاری هەمە جۆر.

ئەمەش بەپێی تاقیکردنەوەکانی ژیان و ئەو بارو دۆخەی کە دێتە رێی ئەو کەسە وەك لەکردارەکانی گەشەی سێکسیو دەروونی ماوەی منداڵ و دەرکەوتنیدا روودەدات.

شەشەم: لادان بریتییە لە دەربرینێك لە هەبوونی دژایەتیو رق لێ بوونەوە لە کەسێکدا، لادانیش بەلای کەسەکەوە پێی وایە لەخزمەتی مەبەستی گرنگی خۆیو خێزان و کۆمەڵەکەیدایە.

لادان بەپێی ئەم لێکدانەوەیە، کەسی لادەر چێژی لێ وەردەگرێت.. هەروەها لادان گۆشەگیری و قین و دژایەتی لەسەر ئاستی خێزان لێ دەکەوێتەوە.

خاوەنی ئەم بیرۆکەیە لەلێکدانەوە گەشبینییەکانیدا دەڵێت: لەبەر ئەوەی دایناميکە سەرەکیەکەی شزوز لادان خۆی لەقین و دژایەتیدا دەشارێتەوە واتە شزوز لادان یارمەتی مەبەستی گۆڕانی قین و دژایەتی لەرێڕەوە ماندوو بووەکەی بۆ لق و جۆگەی رەفتاری دیکە. ئەگەر بێت بەکرداری لادان بە شێوەیەکی راستەوخۆ یان بەخۆخلافان بەخەیاڵەوە یان بەدەربڕینی بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ لەشێوازو وێنەو شێوە هەمە جۆری هونەری یان داهێنانی هەمە جۆر کە هەموو ئەم وێنەو شێوە دەربڕینانە لەتێڕوانینی خاوەن تیۆرەکەوە لەدەربڕینی راستەوخۆی دژایەتیو شاراوە لەنەستی کەسەکەدا لەپاڵ ئەم تیۆرانەدا چەند بیرۆکەو تیۆری هەمەرەنگی دیکە هەیە وەك ئەوەی کە دەڵێت: لادانی سێکسی تا رادەیەکی دیاریکراو لەنێو جیهانی ئاژەڵاندا بەدی دەکرێت هەروەك لەنێو مرۆڤیش دا دیاردەیەکی ناسروشتی نییە بەڵکو دیاردەیەکە دەتوانرێت پێشبینی بکرێت لەسەر بنچینەی دابەش بوونی ژماردنی بۆ دیاردەی رەفتاری لەمرۆڤ دا هەروەها لەو تیۆرانەی دی کە لادانی سیکسی دەگێرنەوە بۆفاکتەری زگماکی و یا هۆرمۆنەکان یا میشك بەلام هەتا ئیستا هیچ بەلگەیەکی وەها نییەو بۆ سەلماندن و راستی ئەم بۆچوونانە. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ ئەندامیك لەمیشکدا نییە ببیتە هۆی دووبارە بوونەوەی لادان لە هەموو کەسیك دا.

**جۆرەکانی لادانی سیکسی**

شیوازو جۆریکی زۆری لادان هەیە، کەلە شیوەو توندو تیژی دووریان لەبارە سروشتیەکەی سیکسییەوە لەیەك جیاوازن، هەندیك لەم لادانانە تەنها لەسەر یەك شیوازی لادان سەقامگیر دەبن، بەڵام زۆربەی زۆری لادەرەکان زیاتر لادانیك پەیرەو دەکەن، ئەمەش لەکاتیکدا یان لەچەند کاتیکی جیاوازدا ، دەتوانین یەکەم لادان کە لادەر پەیرەوی دەکات بەدانیکی سەرەکیو بنچینەیی دابنریت، بۆ دروست بوون و پەیرەوی هەر لادانیکی دی کەبەلادانی ناوەندی دادەنریت، لەبەر ئەوە.. تویژەرەوەکان لادان لەم روانگەوە لەسەر چەند بنچینەیەك پۆلین دەکەن گرنگترینیان پۆلین کردنی لادان لەسەر ئەو گۆرانەی لەبارەی ئامانجی سەرەکیو بابەتی سیکسیو وناسنامەی سیکسییەوە بەئاکام دەگات.

ئێستاش دەتوانین بەپێی ئەو شێوازە بڵاوەی لەبەکارهێنانی ناونانی لادانە سێکسیەکان دا چەند راستیەك روون بکەینەوە وەك لە پۆلین کردنەوەی سەرەوە ئاماژەمان بۆ کرد.

أ- لادانە سێکسییەکانی تایبەت بەگۆڕانی ئامانجی سێکسی:-

١- پیشاندان (نمایش) "الاستعراضیة":- پاڵنەریکە بۆ نمایش و خۆپیشاندانی کەسێك بۆ کەسێکی دی یا بۆ چەند کەسێك.

٢- سەیرکردنی نهێنی" Vogeurism" :- بریتییە لەبەدەست هێنانی چێژی سێکسی لەتیروانینی کەسانی دی بەنهێنی.

٣- سادیزم:- Sadism: بریتییە لە وەرگرتنی چێژی سێکسی لەئەنجام دانی ئازاردانی کەسەکەی بەرامبەری کەسێکسی لەگەڵ دا ئەنجام دەدات.

٤- ماسۆشیزم:- بەپێچەوانەوە بریتییە لە وەرگرتنی چێژی سێکسی لە ئاکامی خۆئازاردان بەدەستی ئەو کەسەی سێکسی لەگەڵ ئەنجام دەدات.

٥- فێتیشیزم "Fetishism":- بریتییە لە بەدەست هێنانی چێژی سێکسی بەهۆی بینینی بەشێك لە جل و بەرگی کەسی بەرامبەر یاخود بینینی بەشێکی بچووك لەلەشی کەسی بەرامبەر کە دەبێتە هۆی وەرگرتنی چێژی سێکسی.

٦- دەردراوی" الافرازیة":- چێژ وەرگرتنی سێکسی پەیوەندی بەدەردراوەکانی لەشەوە هەیە. واتە لەئاکامی هەر دەردراوێکی لەش کە ئەو کەسە چێژی لێ وەردەگرێت بەبینینی یان بۆن کردنی.

٧- شێتی دزین" جنون السرقة":- کەسی لادەر رەزامەندی سێکسی خۆی لەرێگەی دزینەوە بەدەست دەهێنێت.

٨- شێتی ئاگر" جنون الحرق":- پاڵنەریکە بەبەکارهێنانی ئاگر چێژی سێکسی وەردەگرێت. وا هەست دەکات سێکسیش وەك ئاگر گەرم و کلپە دەکات.

ب- لادانە سێکسی یەکان کەلەسەر شێوەی گۆڕانکاری لەبابەتی کرداری‌دا روودەدەن:

١- سێکس لەگەڵ ئاژەڵدا.

٢- سێکس کردن لەگەڵ لەشی مردوودا

٣- سێکسی هاورەگەزی : کە دوو شێوازە:-

أ- نێربازی" اللواطة" لەنێو جیهانی نێردا واتە نێرێك لەگەڵ نێرێکدا سێکس دەکەن.

ب- یان پانۆکێ" سماقیة" لەنێو جیهانی مێینەدا. واتە مێینەیەك و مێینەیەکی دیکە.

٤ -مناڵ بازی:- بریتییە لە پەیوەندی سێکسی لەگەڵ منالیکی نابەکامدا. واتە هەندێ کەسی گەورە چێژ لەکرداریکی سێکسی لەگەڵ منالیکدا وەردەگرن.

ج- لادانەکانی تایبەت بەبابەتە سێکسییەکان:

١- لەبەرکردن" التلبسیة" بریتییە لە دامرکاندنەوەو تێرکردنی سێکس بەهۆی لەبەر کردنی جل و بەرگی توخمی بەرامبەرەوە .

٢- پێچەوانە سێکسی یان سێکسە پێچەوانەیی" الجنسیة المعاکسة".

بریتییە لە ئارەزووکردن لە گۆڕینی بایۆلۆژی توخمی خۆی بۆ رەگەزی بەرامبەر، واتە ئارەزووی کەسێك بۆ گۆڕینی لە توخمەکەی خۆیەوە بۆ توخمی دووەم وەك زۆر لەپیاوان ئارەزووی گۆڕینیان دەکەن بۆ ئەوەی بین بەئافرەت.

تێبینی / زۆر لەم لادانانەی سەرەوە بەلای هەندێك لەتوێژەرەوەکانەوە بریتییە لە هەمەجۆری نەك لادان.

**بڵاوبوونەوەی لادانی سێکسی**

زۆ زەحمەتە بۆ هەر توێژەرەوەیەك بتوانێت سنوورو ئاستی لادان لەکۆمەلیکدا بپێوێ بەهۆی جێگیر نەبوونی شێوازێك تا بەلادان بژمێردرێت لە رووی جۆری پەیوەندی کردنیەوە چونکە ئەم شێوەو شێوازانە هەمیشە گۆڕانیکی بەردەوامن کە ئەم جۆرو گۆڕانکاریانە دەکەویتە ژێر کاریگەری هۆکارە جیاوازەکانی کۆمەڵایەتی و شارستانیەتەوە. جگە لەوەش زۆر زەحمەتە بگەینە راستییەکانی ژیانی ئالۆزی سێکسی ئەندامەکانی کۆمەڵ.

چونکە هەتا ئێستا لادانی سێکسی جێگەی رەخنەو بێز لیهاتنەوەی کۆمەڵەو بگرە یاساکانیشە، بۆیە زۆر زەحمەتە

بتوانرێت ئەو لادانانە لەرووی رادەی زۆری بڵاوبوونەوەیەوە دەستنیشان بکرێت لەبەر ئەوە ناتوانن دان بەو راستیەدا بنێین کە توێژەرەوەیەك دەیەوێت بەکارێکی وەها تەنانەت دەسپەڕ کە بڵاوترین شێوەی‌لادانە، شەرم کردنێك لەگێرانەوەو باسکردنی دا هەیە لەبەر ئەوە زۆربەی ئەوانە دان بەبوونی لادان دا نانێن لەسەر لادانی سێکسی چەندین راوو بۆچوونی جۆراو جۆر هەیە، کە زۆر لەو لادانانە بە" هەمە جۆری-تنوع-" دادەنرێن، یان لیکدانەوەی‌یان لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی دی دەگۆریت، وەك لادانی سیکسی هاوشیوە و هاورەگەز " Homosexual " هەتیو بازی‌و یان یانۆکێ کە بە بڵاوترین لادانە سیکسییەکان دەژمێردرین.

**خۆ رووت کردنەوە" خۆ نواندنی رووتی" " بەرووتی نمایش کردن"**

١- خۆ پیشاندان" الاستعراضیة" Exnibitionism" ئیکسهیبیشیزم" (خۆ رووت کردنەوە)

٢- ئەم لادانە تایبەتە بەکەسی لادەرەوە و کەسەکەش ناتوانیت بەئامانجی بەیەك گەیشتنی سیکسی بەرامبەرەکەی بگات، بەلکو جۆریکە هەر لای خۆیەوە ئەنجام دەدریت، وەك لادانەکانی " تیروانین: تبصریە" و فیتشیزم، لەبەرکردن، کە ئەمانەزۆرترین جۆری ئەوو لادانانەیە کە تایبەتە بەکەسەکە خۆیەوە. کە ئەم شیوازی لادانانە لە رووی یاساییشەوە لێ پرسینەوەی هەیە، چونکە شیوازەکانیان جۆریکە لەسەرنج راکیشانی کەسانی دی کۆمەڵ ئەم لادانەش زیاتر لەناو جیهانی نیردا باوە، دەتوانین بلیین جۆریکە یا بریتییە لەنەخۆشی دەروونی، کەسەکە وا لێ دەکات تام و چیژ لە خۆ رووت کردنەوەو خۆپیشاندانی بۆ کەسانی دی وەربگریت یاخود لەئاوینەوە تەماشای لەش و ئەندامەکانی خۆی بکات، یان زۆرجار کەسەکە ئارەزووی خۆ رووتکردنەوەی بەرامبەر ژنەکەی خۆی هەیە... دکتۆرە نەوال سەعداوی، باس لەبوونی لادانیکی سیکسی وەها دەکات و دەلیت: زۆربەی پیاوان حەز لەم خۆ دەرخستنە دەکەن بەتایبەتی دەرخستنی ئەندامەکانی زاوزێ نموونەیەك دەهینینەوە دەلیت: پیاویك فیر ببوو هەموو رۆژیك خۆی رووت دەکردەوە لەسەربانی مالیکەوە خۆی پیشانی خەلکی دەدا، هەتا کار گەیشتە ئەوەی خەلکی کۆڵان و گەرەکەکە چوونە سەری ئیتر لەو رۆژەوە نەیانبینیەوە.

دەشیت ئەم جۆرە خۆ دەرخستنە لەناو ژنانیش دا هەبیت، بەلام لیکدانەوەی بە لادان ناژمیردریت، چونکە لەژناندا هۆیەکە بۆ وورووژاندنی پیاوان [1]، هەروەها هەندیك پیاوان هەن کە هەست بەکەم و کوری دەکەن و هۆکاریك نییە بۆ خۆ دەرخستن و پیاوەتی خۆیان ، تەنها خۆ رووت کردنەوەو دەرخستنی ئەندامەکانی زاوزێ نەبیت بۆ ئەوەی خەلکی ببینن.

**فیتیشیزم** Fetishisim

ئەم لادانە زیاتر لەنیو نیرینەدا روودەدات کەکەسی لادەر هەول دەدات چیژی خۆی لەبەکارهینانی شتیکی رەگەزی بەرامبەرەکەیەوە وەربگریت فیتیشی ، ووشەیەکی پرتوگالی‌یە مانای " جێ گرتنەوەی یان خستنەبری" یە وەك نەبوونی سەرچاوەیەك بۆ حەوانەوو چیژ وەرگرتنی سیکسی، کە بەهۆی پەیوەندی‌یەکی ناراستەوخۆوە بەهۆی جل و بەرگ و شتی تایبەت بەئافرەتان وەك" مایۆ، کۆلۆن، ستین، ستریج، ژیر کراس..هتد. وەردەگریت یان بینینی ئەو کەل وپەلانەی یان ئەو شتانەی مینە بەکاری دەهینیت، زۆرجار کەسی لادەر چیژ لەجل و بەرگی نوێ وەناگریت بەلکو ئەو جل و بەرگانە وەردەگریت کە لەلایەن ئافرەتەوە بەکارهینراوە، وا دادەنریت کە فیتیشی دیاردەیەکی ناوازەی جیهانی نیرە [2].

ئەو شتانە لەبەرچاوی خۆی دادەنیت و دەوروژیت و دەسپەری پیوە دەکات، گرنگ نی‌یە بەلای کەسی لادەرەوە کەخاوەن جل و بەرگ و شتەکان بناسیت یان نەناسیت لەلایەکی دیکەشەوە لادەر لەکرداری سیکسی راستەوخۆ لەگەڵ کەسیکی دیدا دەترسیت [3].

**سەیرکردنی نهینی** Voyeurism

لادەر هەول دەدا بەهۆی‌سەیرکردنەوە بەنهینی چیژ وەربگریت، ئەویش تەماشا کردنی کەسیکی رووت بەدزیەوە، یان سەیرکردنی کرداری سیکسی نیوان دووکەسی دی، هەر چەندە ئەم شیوازە کاریکی سروشتی‌و ئاسایی‌یە کە بینینی کرداری سیکسی دەبیتە هۆی وروژاندن. بەلام لادانەکە لەوەدا خۆی دەگریتەوە. کە ئەو سەیرکردنە ئەلتەرناتیفی بیت بۆچیژ وەرگرتن کە ئەگەر ریگەی کرداری سیکسیش هەبیت. ئەم لادانەش زیاتر لەناو جیهانی پیاواندا هەیە لەتویژینەوەیەکی " کینزی"دا دەرکەوت کە نزیکەی" ٦٥٪" پیاوان ئەم شیوازەیان پەیرەو کردووە، جا ئەگەر ئەو پەیرەو کردنەش ناو بەناو بووبیت یان لەسەردەمیکدا پەیرەوی کردووە. لادەر بەبینینی ئەو بارە دەسپەر دەکات بێ ئەوەی هیرش بکاتە سەر بینراوەکە [4].

**لەبەرکردن** Transvestism

ئەم لادانە بریتی‌یە لە لەبەرکردنی ئەو جل و بەرگانەی کە رەگەزی دووەم" بەرامبەر" لەبەری دەکات لەلایەن کەسی لادەرەوە لەشوینی نهینی‌دا لەبەری دەکات، واتە کاتیك تەنها

بێت لەم کاتەدا دەسپەر دەکات بەڵام هەندێک لەکەسەکان "لادەرەکان" ئەم جۆرە هەلس و کەوتە دەکەن بۆ پیشەنگی کردنی کرداریکی سێکسی لەگەڵ رەگەزی هاوشێوەدا، شیکەرەوەکان لەلیکدانەوەی ئەم لادانەدا دۆشداماون. هەر چەندە لەمنالیدا کورو کچ حەز بەلەبەرکردنی جل و بەرگی یەکتری دەکەن، بەڵام ئەم بارە ناتوانرێت بەلادان بژمێردرێت.

**خۆ تێ هەلسوون" التحرشیە"**

جۆریکە لەلادان کەنێر زیاتر پەیرەوی ل‌دەکات و لەنیوان لادانی خۆپیشاندان و فیتشیزم دایە، کە پیاوان "نێر" خۆ دەسون لە ئافرەتان" می بەتایبەتی لەشوینە قەرەبالغ و پرەکاندا. کە خەلکی تیا کۆبۆتەوە وەك سینەماکان و ناو پاص و ئاهەنگ و یانە تێکەڵاوەکان. کە ئەم خۆ تیهەلسوونە هەلیکە بۆ ورووژاندنی سێکسی لادەر بەڵام پەیرەوکردنی بە لادان دەژمیردریت.

**منالبازی "الاطفالیة"**Paedophillia

لەم بارەدا کەسی لادەر ئارەزووی منالیکی بچووك دەکات کەلەرەگەزی خۆی یان لەرەگەزی بەرامبەر بێت، ئەم لادانەش زیاتر لەناو کوراندا باوەو هەندیك لەمیینەش تارادەیەك ئەم کردارەیان هەیە بەڵام زۆربەی زۆری ئەم لادانە نێرەکان لەگەڵ منالیکی هاو رەگەزی خۆیان دەیکەن بەتایبەتی منداڵی هەتیوی بێ کەس و کار یان ئاوارە. چەند لیکدانەوەیەك بۆ ئەم لادانە هەیە، هەندیك وای بۆ دەچن بەتالکردنەوەیەکی پالنەری سێکسیە، هەندیکی دی پییان وایە دریژبوونەوەیەکی یان پاشکۆیەکی شارستانیەتی هەندیك کۆمەلگە جیا جیاکانی جیهانە. بەڵام هەندیکی دی لەو کەسانەی پەیرەوی ئەم لادانە دەکەن لەپەیوەندی سێکسی تەواو بەگومانن. چونکە لەو پەیوەندیەدا لەگەڵ ئەو منالانەدا بۆشاییەك دروست دەکەن، بۆ ئاراستەکردنی یان دەربرینی ئارەزووەو سێکسیەکانیان بێ هیچ سەرئیشەو باری دەروونیەك کەسانی لادەر نەخۆشییەکی دەروونیان یان ئەقلیان تیدا نییە.

هەرچەندە ئەوانەی ئەم لادانە پەیرەو دەکەن بەلایەنی کەمەوە کەمیك تووشی پەککەوتنیسێکسی بوون. کە ئەم کارە کەمتر ئەو پەککەوتنەی تیدایە.

**جیرۆنتۆفیا " کهولیة"** Gerontophilia

لەم جۆرە لادانەدا کەسەکە" نێر یان مێ ئارەزووی ئەنجام دانی سێکسی لەگەڵ کەسیکدا هەیە کە چەند سالیك لەتەمەنی خۆی گەورەتر بیت، ئەم جۆرە ئارەزوومەندییە بە لادان ناژمێردریت، ئەگەر بەهۆی بارودۆخی کۆمەلایەتیو ئابووریەوە دروست بیت یاخود لەبەر پیویستییەکی سێکسی رووبدات، لیکدانەوە بۆ ئەم لادانە لەسەر چەند بنچینەیەکی جیاواز پیك دیت کە دەبینریت جۆریك لەدیاردەی "کپاندنی" ژیانی سیکسی دەروونی قۆناغی ئۆدیبی یا ئەلکترای تیدایە، کە لەم قۆناغەدا منداڵ مەیلیکی زۆری بەلای یەکیك لەدایکی یان باوکی دەجولیت یاخود بەیەکیکیانەوە پەیوەندیدارو پابەند و هۆگر دەبیت، وەك کچ هۆگری باوك دەبیت و کور هۆگری دایك، لەبەر ئەوە کەسی لادەر بەدوای کەسیکدا دەگەریت،یان مەیلی هەیە کە لەو تەمەنەدا بیت، کە جیاوازییەکی زۆری تەمەن لەنیوانیان دا هەیە، دەبینین لەلای میینەیەك هۆگری کەسیکی زۆر بەتەمەن لەخۆی گەورەتر دەبیت.

**سێکس لەگەڵ مردوودا" الجثمانیة"** Necrophilia

لەم جۆرە لادانەدا کەسەکە هەول دەدات لەگەڵ کەسیکی مردوودا سێکس بکات، هەندیك جار دەگاتە رادەی ئەوەی کە گۆرەکان هەلبدەنەوە بۆ ئەنجام دانی لادانەکانیان یان کوشتنی کەسیك ئەنجام بدەن، بۆ ئەوەی بەلاشەی کوژراوەکە بگەن، رووشی داوەکە هەندیك کەس هەمیشە لەنیو گۆرستانەکان دا بسورینەوە بۆ ئەو مەبەستە، کە زۆر زەحمەتە بەتەواوەتی هۆکارەکانی ئەم لادانە بزانریت، بەڵام بەپیی هەندیك شیکرنەوە گوایە بەهۆی هۆگری کەسی لادەرەوە کەلەسەرەتایی منالیدا بەیەکیك لەدایك و باووکە مردووەکەیەوە کە ئەم جۆرە لادانەی سێکسییەی لەگەڵ لاشەی مردووەکەیدا دەربرینی یەکگرتنە لەگەڵ مردووەکەدا، بەڵام هەندیکیدی دەڵین: گوایە جۆریکە لەبیری دەسەلاتدار" الفکر التسلطي" کە ئارەزوومەندی فیکری خۆی جێ بەجێی دەکات.

**سێکس لەگەڵ ئاژەلدا** Zooerasty

هەندیك کەس ناچار دەبن لەگەڵ ئاژەلدا سێکس ئەنجام بدەن. ئەمەیش هۆکاری کۆمەلایەتیو کەسیتی دەور دەبینیت، بەتایبەتی لەدانیشتوانی لادێ نشینەکاندا کە زیاتر ئاژەڵ لەئیش و کاری رۆژانەیاندا بەکار دینن، ئەم دیاردەیە بەلادانی سێکسی ناژمیردریت ئەگەر هۆکارەکە کەبتی سێکسی بیت یان ئارەزووی سێکسی لەگەڵ هەندیك ئاژەلی تایبەتدا ئەنجام بدات، بەڵام ئەم شیوازە بەدەروازەیەکی دلنیایی بیت بۆ کەسەکە بە وونکردنی توانای سێکسی. و ترسی ئاشکرا بوونی ئەو بارە لەپەیوەندی سێکسی سروشتی لەگەڵ کەسیکدا بەلادان دەژمێردریت، کە کەسەکە ئاژەڵ هەلدەبژیریت، بۆ ئەوەی نهینییەکەی ئاشکرا نەکات، بەڵام هەندیك وا لیکیدەدەنەوە کە گوایە بریتییە لە رق و کینەیەك دژ بە هەموو شتیکی مرۆڤایەتیو مرۆڤ خۆیشی[٦]

هەندیکی دی دەلێن پەیوەندی سێکسی لەگەڵ ئاژەلدا بریتییە لە دژایەتیەکی سروشتیانە پاشان لەدوایدا بەشێوەیەکی ساز جێگیر دەبێت.وەکو ووتمان ئەم پەیوەندییەش لەو شوێنانەدا زیاتر روودەدات کە تێکەڵ بوونیان بەئاژەڵو بەخێوکردنی ئاژەلەوە هەیە، کە جووتیارەکان دەتوانن زۆر بەئاسانی ئەم پەیوەندییە دروست بکەن.

لەبەر ئەوە هەر کەسە جۆرێك ئاژەڵ بۆ خۆی هەلدەبژێرێت. هەمان مەبەست، ئەوەیش بەپێی بۆچوونی لێکدانەوەو ئارەزوومەندی کەسەکە بۆ جۆری ئاژەلەکە.. وەك گوێ درێژو ماین و مەرو بزن و سەگ.. هەندیك جاریش پەنا دەبریتە بەر بالندەو پەلەوەرەکان. زۆرجاریش لەشارەکاندا سەگ زیاتر بەکاردیت بەتایبەتی لە ولاتە خۆر ئاواییەکاندا. بەپێچەوانەوەو ئەم شێوازەیان لەنێو جیهانی مییەنەدا روودەدات. بەڵام ئەوانی دی پەیوەندیدارن بەنێرەوە هەر ئەوان ئەو پەیوەندییە دیاری دەکەن.

فرۆید بەپێی لێکۆلینەوەو شیکردنەوە دەروونیەکان دەلێت: " سێکس لەگەڵ ئاژەلدا بریتییە لە خستنەبەری یان لەجیاتی دانانی گونجاو بۆ دوورکەوتنەوەی مرۆڤ لەگرێی سێکسی ئۆدیب". کە لەخۆرئاوادا ژنان زۆر بەکاری دەهێنن، بەتایبەتی ئەو ژنانەی کە چوونەتە تەمەنەوەو مێردەکانیان جیا بوونەتەوە، یان مێردەکانیان مردوون...

هەرچەند بەلای هەندیکەوە ئەم بارە بەلادان ناژمێردرێت" هەروەها ئەوەیش لەبیر نەکەین کە ئەم لادانە شێوەیەکی دیکەی هەیە ئەویش بینینی راستەوخۆی کەسەکە بۆ کرداری سێکسی نێوان دوو ئاژەڵ کە وەك وورووژێنەرێك دەبێتە هۆی وەرگرتنی چێژی سێکسی .. کەزانایان ئەم شێوازەیش بەلادان دادەنێن. [7]

**پەراوێز:**

[1] الانحرافات الجنسية عند الرجل والمرأة/ جمال مصطفى مردان/ مكتبة النهضة-بغداد- طبعة الاولى بغداد- ١٩٨٤ ل ٥٦

[2] هەمان سەرچاوە. ل٥٢

[3] الجنس والنفس في الحياة الانسانية ل ٢١٦

[4] هەمان سەرچاوە ل ٢١٧

[5] لادان لای فرۆید بەشزوز لێکدراوەتەوە، یان ئاراستە کراوەو دەربراوە.

[6] هەمان سەرچاوە. ل ٢١٩

[7] اسرار الحياة الزوجية. دكتورة ماري ستوبس/ دار الاندلس- بيروت- طبعة العاشرة/ ١٩٦٧

## (زانایەکی "سوری" ڕێبازێکی نوێ بۆ پاکردنەوەی ئاو دادەهێنێت

تۆژەریکی"سووری" توانی ڕێبازێکی نوێ لەپاکردنەوەی ئاو لە"نیترات و نیترۆتەکان" دەستەبەر بکات و، دەزگای داهێنان و مارکە تۆماکراوەکانی روسی مافی داهێنانی بەخشیە(د.بسام العجی) کە موحازەرە لەزانکۆی (دمشق) دەلیتەوە بەرامبەر بەم داهێنانەیو، لەبروانامەی داهینانەکەیدا هاتووە کەوا مافەکانی لەسەرجەم خاکی رووسیادا بۆ ماوەی(٢٠)ساڵ کاری پێ دەکرێت.

لەو بەلگە نامانەی کە لەگەڵ بروانامەکەدا هاتووە داهێنانە کەلەپاك کردنەوەی ئا وی سروشتیو ئاوی ئاوەرۆکاندا وەکو یەکن و، گرنگی ئەم ڕێبازە لە توانینی بەکارهێنانی مادەی هەرزان لەکاری پاکردنەوەکەدایە، هەروەهائەم ڕێبازە خەستەو نیشتووەکانی تیدا دروست نابێت لەکاری پاك کردنەوەکەدا .

شایەنی باسە تۆژەر (د.العجی) لەوەو پێش دوو کتێبی دەربارەی کیشەو گرفتەکانی ژینگەو سەرچاوەکانی پیس بوون و ئامێرەکانی پاك کردنەوە نوێیە بەکارهاتووەکانی لە ژمارەیەك لەولاتانی جیهاندا بەچاپ گەیاندووە...

## "زیادکردنی بەکارهێنانی (پاریزەر) بۆ ڕیگەگرتن لەبلاوبوونەوەی ئەیدز"

**واشنتن:**

پەیمانگەی (جۆنز هۆپکینز)لە (بلتیمۆر)ی سەر بە ویلایەتی(مێریلاند)ی ئەمەریکی لیکۆلینەوەیەکی بلاوکردەوەو تییدا ووتی کە پێویستە بەکارهێنانی پاریزەر کەلەلایەن رەگەزی نێرەوە بەکاردیت سێ ئەوەندەی ئێستا کە بەکاردیت زیاد بکرێت گەر بویستریت رێگە لەبلاوبوونەوەی نەخۆشی ئایدز و نەخۆشییەکانی دیکەی کەلەرێگەی پەیوەندییە سێکسییەکانەوە دەگوازرێنەوە.

تۆژداران لەو لیکۆلینەوەیەی گۆڤاری (پوپیولیش ریپورتس) بلاوی کردەوە ئاماژەیان بەوەدا کە بۆرێگەگرتن لە دووچاربوونەکان لەئاکامی جووت بوونە سێکسییەکانەوە دەکەونەوە پێویستە بەکارهێنانی سالانەی پاریزەر بگاتە"٢٤"ملیار لەبری ئەو (٦ بۆ٩) ملیارەی ئێستا بەکاردەهێنرێت و، ئاماژەشی بەدووچاربوونی(١٦) هەزار کەس رۆژانە بەڤایرۆسی ئایدز تۆمار دەکرین داو سالانەش نزیکەی(٣٣٣) ملیۆن باری نوێ لەو نەخۆشیانەی لەرێگەی جووت بوون و پەیوەندی سێکسییەوە دەگوازرینەوە تۆمار دەکرێت و، یەکەم لیپرسراوی لیکۆلینەوەکە(رۆبەرت گاردنەر) ووتی جێی داخە کەبەرنامەکانی رێکخستنی خیزانەکان بەشێوەیەکی گشتی بایەخی زیاتر بە ئافرەتە بەشووەکان دەدات لەم بوارەدا، لەکاتێکدا بۆ رێگەگرتن لە دووچار بوون بە ڤایرۆسی ئایدزو ئەو نەخۆشیانەی لەرێگەی پەیوەندییە سێکسییەکانەوە دەگوازرینەوە پێویستی بە بەکارهێنانی پاریزەر هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە ژنیان نەهیناوە یان شوویان نەکردووە و بەتایبەتیش لاوەکان.

الزمان/ ٣٢٨

# گەشتی ملیۆنی (ڤۆیجەر)و دوا هەواڵی

جوان محەمەد رەئوف

لەو کاتەوەی کە مرۆڤ دەستی بە گەشتە فەزاییەکان کردووە کەهەر لەشەستەکانی سەدەی بیستەمەوە بوو، لەو کاتەوە تا ئێستا بە دەیان کەشتی فەزایی و مسباری فەزایی رەوانەی بۆشایی ئاسمان کراون، بەڵام لە نێو ئەوانەدا هەموویان تەنها چوار کەشتی ئاسمانی مەودا دوری دیارینەکراو نێرراون بەرەو ئاسمان بەمەبەستی دۆزینەوەی زیاتری نهێنییە گەردوونیەکان و گەڕانیش بە دوای ژیانێکی دیکەی وەک ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی وەیان شارستانیەتیەکی دیکەی وەک شارستانێتییەکەی خۆمان، ئەو چوار کەشتیەش بریتین لە{(بایۆنیر١٠)،(بایۆنیر١١)،(ڤۆیجەر ١) وە (ڤۆیجەر ٢)}، ئەو کەشتیانە هەموویان لە حەفتاکانی سەدەی رابووردووەوە نێرراون بەرەو فەزاو تا ئێستاش بەرێوەن لە رۆیشتن بەرەو قوڵایی گەردوون و گەشتی نێوان هەسارەکانی کۆمەڵەی خۆرو دەرچووانیش لە کۆمەڵەی خۆرو گەیشتن بە جیهانێکی نادیار. کەشتی فەزایی ئەمەریکی (ڤۆیجەر١) لە مانگی ئابی ساڵی ١٩٧٧ دا هەڵدرا بەرەو فەزاو یەک مانگ دوای ئەوە کەشتی فەزایی(ڤۆیجەر ٢) هەڵدرا وەک پاڵپشتێک بۆ (ڤۆیجەر١)، هەردوو کەشتیەکەش لەبنکەی فەزایی (کیپ کینداڵی)ئەمەریکیەوە هەڵدراون، زۆربەی زانا فەزاییەکان لەسەر ئەوەن کە هەردوو کەشتی فەزایی ڤۆیجەر بەسەیرترین دروستکراوەکانی دەستی مرۆڤ لەسەدەی بیستەمدا دادەنرێن، ئێستا هەردوو کەشتیەکە بەردەوامن لەرۆیشتندا بەرەو قوڵایی گەردوون و بەملیارەها کیلۆمەتر لەزەوییەوە دوورن، بەتەواوی ئێستا هەردوو کەشتیەکە گەیشتوونەتە لێوارەکانی کۆمەڵەی خۆری خۆمان، خۆ ئەگەر (ڤۆیجەر١)توانی ووزەی پێویست بۆ خۆی دابین بکات لە خۆرەوە چونکە وورده وورده لە خۆر دوور دەکەوێتەوەو خۆریش سەرچاوەی ووزەکەیەتی، ئەوا لە ماوەیەکی کەمی داهاتوودا(ڤۆیجەر ١) لەسنووری کۆمەڵەی خۆر دەردەچێت و دەچێتە نێو دونیایەکی زۆر نادیارو شاراوە لەئێمەوە، پاش تێپەڕبوونی (١٨)مانگ بەسەرهەڵدانی(ڤۆیجەر١)دا ئەو توانی بگاتە نزیکی هەسارەی زوحەل کە نزیکەی (٦٥٠) ملیۆن کیلۆمەتر لەزەوییەوە دوورە و توانی یەکەمین وێنەی زۆر جوان و روون بنێرێ بۆ ئەو هەسارە زۆر جوانە. لە مانگی ئابی ساڵی١٩٨٩دا ڤۆیجەر ١٩ توانی بگاتە سنووری هەسارەی نبتۆن و وێنەی زۆر روون و جوانی نارد سەبارەت بە کەش و بارو دۆخی سەر هەسارەی نبتۆن، ئیتر هەر بەو

جۆرە دووکەشتیەکە بەردەوام بوون لەگەشتی خۆیان دا بە نێو هەسارەکانی کۆمەڵەی خۆرداو ئەوەی کە زاناکان زۆر بەشەوقەوە چاوەڕوانی دەکەن دەرچوونی کە شتیەکانە لە سنووری کۆمەڵەی خۆر، بەڵام تا ئێستاش زاناکان هیچ دەربارەی ئەو ماوانەی کەتیایدا دوو کەشتیەکە لە هێزی کێش کردنی خۆر دەردەچن نازانن هەروەها چییان بەسەردا دێت؟ لەبەر ئەوەی کە یەکێك لەمەبەستەکانی ناردنی ئەو کەشتیانە بریتی‌یە لە گەڕان بەدوای شارستانێتی دیکەی وەك شارستانێتی‌یەکەی خۆمان، هەر بۆیە لەسەر کەشتیەکان گەلێك نامەو پەیام بەرەو فەزا نێرراون بەمەبەستی وەڵامدانەوەی لەلایەن بوونەوەرانی دیکەی گەردوونیەوە وەك مرۆڤ کە ئەگەر هەبن، لەو نامە و پەیامانەش: دوو کاسێتی مودەمەج کە تیایاندا باس لە هەندێك لە رووکارەکانی ژیان دەکرێت لەسەر زەوی وشوێنی زەوی لەگەردووندا دیاری دەکات، هەروەها تۆمارێك بە(٦٠) زمان کە تیایدا سەلامی دانیشتوانی سەر زەوی دەنێرێت بۆ ئەو بوونەوەرانە، جگە لەوانەش کاسێتێکی (٩٠) خولەکی کەتیایدا گەلێك لە مۆسیقای جیهانی و مۆسیقای میللەتانی تیادا تۆمار کراوە، هەروەها دەنگی زۆر لە دیاردە سروشتیەکانی وەك دەنگی هەورە گرمەو باوبۆران و دەنگی گیاندارانی دی تۆمارکراون، جگە لەمانەش کاسێتی تۆماری دەنگی(جیمی کارتەری) سەرۆکی ئەو کاتەی ئەمەریکاو دەنگی (کۆرت ڤاڵد هایمی) ئەمینداری ئەو کاتەی نەتەوە یەکگرتوەکانی لەسەر ئەو کەشتیانە نێرراون بەرەو فەزا و قولایی گەردوون. زانا گەردوونیەکان دەڵێن کە ئەگەر ئەو دوو کەشتیە توانییان بمێننەوە ئەوا پاش (٤٠) هەزار ساڵی دیکە ئەوان دەگەنە یەکەمین کۆمەڵەی خۆری دراوسێی کۆمەڵەی خۆری خۆمان و ئیتر ئەو کاتەش کەشتیەکان لەمەودای هێزی کێش کردنی خۆر دەردەچن و هەریەکەیان ماوەی (٢٣)ملیار کیلۆمەتریان بڕیوە!! هەروەها بەپێی بۆچوونی زانایانی گەردوونی هەردوو کەشتیەکە لەدەورو بەری ساڵی(٢٠٢٠)دا لە سنووری کۆمەڵەی خۆر دەردەچن، ئەو کاتەش زاناکان چاوەڕوانی زانیاری تەواوو زۆر وورد دەکەن سەبارەت بەماوەی نێوان کۆتایی کۆمەڵەی خۆرو سەرەتای فەزایەکی دیکە کە هەردوو کەشتیەکان دەیدەن، هەتا ساڵی ١٩٩٠ کەشتیەکان بەردەوام بوون لە ناردنی زانیاری پێویست.

بەڵام سەبارەت بەو ماوانەی کەهەریەکەو لەکەشتیەکان تا ئێستا بڕیویانە، ئەوا (ڤۆیجەر١) لەسەرەتای ساڵی ١٩٩٢دا لە دووری (٦,٩)ملیار کیلۆمەترەوە بووە لە زەویەوەو خێراییەکی سەر سوڕهێنەر دەڕوات بەجۆرێك کە(٣,٥) یەکەی فەزایی دەبڕێت لەساڵێك دا(یەکەی فەزایی دەکاتە ١٥٠ ملیۆن کیلۆمەتر)، تا ئێستاش هەردوو کەشتیەکان بەباشی کاردەکەن، چونکە لەمانگی شوباتی ساڵی١٩٩٨دا (ڤۆیجەر ١) لە دووری (١٠,٥) ملیار کیلۆمەترەوە بووە لەزەویەوەو بە خێرایی (١٧,٤) کیلۆمەتر لەچرکەیەکدا (٣٩ هەزار میل لە کاتژمێرێکدا) لە خۆر دوور دەکەوێتەوە، بەڵام (ڤۆیجەر ٢) ئالەو کاتانەدا لە دووری(٨,١) ملیار کیلۆمەترەوە بووە لە زەویەوەو بە خێرایی (١٥,٩) کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا دەڕۆیشت و لەخۆرەوە دور دەکەوتەوە!.

بە درێژایی گەشتی ملیۆنی هەردوو کەشتی فەزایی (ڤۆیجەر١،٢) خزمەتی زۆر پێش کەش کراوە لە بواری ناسین و دەرخستنی بەشێك لە نهێنی‌یەکانی دونیای هەسارەکانی کۆمەڵەی خۆرو بەتایبەتیش هەسارەکانی وەك زوحەل و ئۆرانۆس ونیبتۆن کە هەتا ناردنی کەشتیەکانی بایۆنیرو ڤۆیجەر زانیاری زۆر کەم هەبوو دەربارەیان بەبەراوورد لەگەڵ زانیارییەکانی کەلەبەردەستدا بوون سەبارەت بە هەسارەکانی وەك زوهرەو مەریخ و موشتەری. لەو دۆزینەوە گرنگانەی کەشتی فەزایی (ڤۆیجەر ١) دۆزینەوەی سێ مانگی تازە کەبەدەوری زوحەلدا دەسوڕێنەوە، هەروەها ناردنەوەی وێنەی زۆر جوان و روون بۆ ئەڵقە جوان و رەنگینەکانی دەوری ئەو هەسارەیەیە، هەتا پێش ناردنی کەشتی ڤۆیجەرەکانی(٢،١)وا دەزانرا کە ئەڵقەکانی دەوری زوحەل تەنها حەوت ئەڵقەن، بەڵام ئەو ووردەکاری‌یەی کە ڤۆیجەرەکان ناردوویانە دەریان خستووە کە ئەڵقە سەیرەکانی دەوری زوحەل هێجگار زۆرن و ئەڵقەکان لەناو یەکدان و بە سەدان ئەڵقەدەبن کەبچووکەکانیان دەکەونە ناو گەورەکانیانەوە، لەوەش دەچێت کە ئەو ئەڵقانە پێکهاتەیەکی زۆر ئاڵۆزیان هەبێت، هەروەها کەشتی فەزایی ڤۆیجەر زانیاری زۆر تازەو ووردیان ناردووە سەبارەت بە کەش و هەوای زوحەل ومانگی(تایتن)کە یارمەتیدەرن بۆ زیاتر تێگەیشتنی بنەڕەتی کۆمەڵەی خۆرو چۆنێتی دروست بوونی.

شایانی باسە کە هەسارەی زوحەل زیاد لە(١٦٩ مانگی هەیەو کەشتیەکانی ڤۆیجەر زانیاری و وینەی باشیان ناردووە بۆ ئەو مانگانە کەشتی (ڤۆیجەر١)نزیکەی (١٠)ئامیری زانستی جیاجیای پیشکەوتوو و ئالۆزی هەلگرتووە، لەوانەش ئامیری هەست پیکردنی تیشکی گەردوونیو ئامیری پیوانەکردنی هیزی موگناتیسی لەفەزادا، هەروەها ئامیری شەبەنگبینی تیشکی خوار سوورو تیشکی سەروو بنەوشەیی بۆ پێوانی پلەی گەرمی هەسارەکان، هەروەها ئامێری گەڕان بەدوای ئاوێتە ئۆرگانیەکاندا، هەروەها لەسەر کەشتیەکان ئامێری پەخشی رایۆیی وای تێدا هەیە کە لە توێژینەوەی زانستی رووتدا بەکار دەهێنرێن جگە لەوانەش دوو کامیرای تەلەفزیۆنی زۆر بەتوانا لەسەر کەشتیەکان هەن کە دەتوانن تەنەکان لە دوورایی (١,٥) ملیۆن کیلۆمەترەوە زۆر بە جوانی ببینن و لەیەکتر جیابکرێنەوە. هەر چەندە زۆر گرفت و کۆسپ هاتنە بەردەم گەشتی کەشتیەکانی ڤۆیجەر، بەلاّم لەگەڵ ئەوانەشدا ئەو کەشتیانە بەردەوام بوون لەرۆیشتن هەتا لە رۆژی ٢٥ ئابی ساڵی١٩٨١دا کەشتی ڤۆیجەر ٢ لە خولگەی هەسارەی زوحەل دەرچوو بەرەو هەسارەی ئۆرانۆس و نیبتۆن رۆیشت، هەر بەگەیشتنی کەشتی( ڤۆیجەر٢) بەسنووری هەسارەی ئۆرانۆس زانیاریەکانی سەبارەت بەو هەسارەیەو پێنج مانگەکەی نارد بەرەو زەوی هەروەك پێشتر بۆ هەسارەی زوحەل ئەنجامیدا بوو. هەروەها گەیشتنی (ڤۆیجەر٢) بەسنوری هەسارەی ئۆرانۆس لە مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٨٦ دا بوو، کەبەرادەیەکی وا نزیك بوەوە لە هەسارەی ئۆارنۆس کە ماوەی نێوان کەشتیەکەو مانگی ئۆرانۆس(میراندا)دەگەیشتە(٢٩٠٠٠) کیلۆمەتر، دوای ئەمەش کەشتی (ڤۆیجەر ٢) لە مانگی ئابی ١٩٨٩دا گەیشتە سنووری نیبتۆن و لەبەرزایی (١٠) هەزار کیلۆمەترەوە بەسەر مانگی تریتۆنی هەسارەی نیبتۆندا فڕیو زانیاری باشی ناردەوە بۆ زەوی سەبارەت بەو هەسارەیەو مانگەکانی بەتایبەتی تریتۆن کە تیرەکەی دەگاتە چەند سەد مەترێك، تریتۆن ماوەی(٣٥٠) هەزار کیلۆمەتر لە هەسارەی نبتۆنەوە دوورەو خولگەیەکی بازنەیی هەیە بەدەوری نیبتۆندا و قەوارەکەیشی هەربە ئەندازەی قەوارەی مانگی زەویە، خولگەی سوڕانەوەی مانگی تریتۆن بە دەوری نیبتۆندا بە گۆشەی (٢٨) پلە لارە لەگەڵ خولگەی نیبتۆن خۆیداو سوڕانەوەکەیشی پێچەوانەی سوورانەوەی نیبتۆن خۆیەتی(واتە سورانەوەی تریتۆن بەدەوری نیبتۆندا)، مانگی دووەمی نیبتۆن بریتییە لە(نیرید) کەلەسەر خولگەیەکی هێلکەیی بەدەوری نیبتۆندا دەسوڕیتەوەو ماوەی (٩) ملیۆن کیلۆمەتر لە نیبتۆنەوە دوورەو سیفاتی فیزیایی ئەو مانگە تا ئێستاش زانراو نیە چونکە ناکەوێتە سەر رێڕەوی رۆیشتنی کەشتیەکانی ڤۆیجەرو هیچ زانیارییەك سەبارەت بەو مانگە بەدەست نەکەوتووە.

بەو جۆرە گەیشتنی هەردوو کەشتی ڤۆیجەر بە هەسارەی نیبتۆن و ناردنەوەی وێنەو زانیاری تەواو دەربارەیان دوا زانیاری بوون سەبارەت بە کۆمەڵەی خۆر کە لە ڤۆیجەرەکانەوە بەدەست هاتبن و ئێستا ڤۆیجەرەکان ئامادەن بۆ دەرچوون لە سنووری کۆمەڵەی خۆری خۆمان بەرەو دونیایەکی نادیارو پڕ نهێنی!!.

**سەرچاوەکان:**

١–رادیۆی دەنگی ئەڵمانیا/مانگی ١٠ی /١٩٩٩

٢–گۆڤاری العلوم/ ژ ٤ وە ژ ٢٦ / ١٩٨٤/١٩٨٧

٣–گۆڤاری العلم والشباب /ژ ٩٢/١٩٨١

٤–نامیلکەی (الحیاة الذکیة في الکون) تألیف/د. حمید مجول النعیمی/ ١٩٨٩

# پەنیری پێستە
# AUSHARI CHEESE

خالد محمد خاڵ
مامۆستای تەکنۆلۆژیای شیرەمەنی
لە زانکۆی سلێمانی

**کورتەیەك دەربارەی مێژووی پەنیر**

مرۆڤ لەزۆر کۆنەوە زانیاری دەربارەی شیر هەبووە، کە لە دروست کردنی پەنیردا کەرەسەیە. مرۆڤ لەشەش هەزار ساڵ پێش زایینەوە وەك خۆراك پەنیری بەکارهێناوە. لەبەر ئەوەی شیر زوو دەترشێت، بەتایبەتی کەپلەی گەرمی بەرز دەبێتەوەو ترشی دروست دەبێت لە ئەنجامی پرۆسەی ترشبوونی سروشتیدا لەبارو دۆخیکی ئاساییدا، کە دەبێت بەهۆی مەیینی شیرەکەو جیابوونەوەی شلەمەنییەك کە پێی دەڵێن( ئاوی پەنیر Whey). لەبەر ئەوە پەنیر بەیەکەم بەرهەمی شیرەمەنی دادەنرێت کە لە بەرەبەیانی مێژووی تۆمارکراوەوە ناسراوە.

لەدروست کردنی پەنیردا شیری ئاژەڵی شیرداری ناوماڵ بەکارهێنراوە، وەك مانگاو گامێش و مەروبزن. و پەنیر وەك خۆراکێکی گرنگ لەو سەردەمە زۆر کۆنەی مێژوودا بەکارهاتووە. لەوانەشە سەرەتای دۆزینەوەی چۆنیەتی دروستکردنی بگەڕێتەوە بۆ ڕێکەوت، ئەوەش بەهەڵگرتنی شیر لەپێستی ئاژەڵی سەربڕاوا دوای شتنی و بەکارهێنانی وەك قاپ و قاچاخی ئەمرۆ. زانراوە کەوا ئەنزایمەکان لە خانەی دیواری گەدەی چوارەمی ئاژەڵی کاوێژکەردا هەن، ئەم ئەنزیمانە دەبن بە هۆی مەیینی شیرو جیابوونەوەی بەشێك لە ئاوی پەنیر لێی و دەرکەوتنی شیرە مەییوەکە بەشێوەیەکی نیمچە رەقی یەکگرتوو. دوای خواردنی پەسندکراوە لەلایەن مرۆڤی ئەو سەردەمە کۆنەوە بەدڵی خەڵکی بووە.

ئەم کارە زۆر جار دووبارە کراوەتەوە تا گەیشتوونەتە چۆنیەتی دروستکردنی پەنیر بەشێوەیەکی سەرەتایی.

دەتوانرێت فیرعەونەکان لە میسر بەیەکەم کەس دابنرێن کە باسی دروستکردنی کەرەو پەنیریان کردووە لەمێژوودا پێش چوار هەزار ساڵ پێش زایین، وەك دەردەکەوێت لەو وێنەو نەقشانەی کە دۆزراونەتەوە لە شوێنەواری پەرستن و گۆڕستانەکاندا ئێستا زۆر جۆر پەنیری باش هەن کە لە جیهاندا ناسراون و دەفرۆشرێن بەو ناوانەی کە کۆن پێی ناسرابوون، وەك پەنیری پارمیزانی parmesanی ئیتاڵی کە مانای پەنیری هەیڤیە (مانگیە) چونکە لە شێوەو رەنگی هەیڤدایە. هەروەها ناوی پەنیری رۆکفۆری Roquefort فەرەنسی لەناوی ناوچەیەکی فەرەنسییەوە هاتووە کە لە کۆنەوە بە دروست کردنی ناسراوە کە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٠٧٠ م. کە لە دێرەکاندا دروست دەکرا. هەروەها مێژووی دروستکردنی پەنیری چیدەری Cheddarی ئینگلیزی دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە (٥٠٠) ساڵ لەمەوپێش لەیەکێك لە گوندەکانی بەریتانیا کەبەهەمان ناو ناسراوە. پەنیری گۆدای Gouda هۆڵەندیش لەسەدەی چواردەهەمدا دروستکراوە. هەروەها پەنیری دیکەش.

**نرخی ئابووری پەنیر:**

ئاسان نییە کە بتوانرێ پێناسەیەکی دیاریکراو بۆ پەنیر دابنرێت، بەهۆی زۆری جۆرەکانیەوە، چونکە زیاد لە(٥٠٠) جۆر پەنیر هەن کە جیاوازیان هەیە لەناو یەکداو لە جیهاندا دانیان پیانراوە. سەرەڕای ژمارەیەکی زۆری دیکە لەو پەنیرانەی کە لەزۆربەی جیهانی سێهەمدا دروست دەکرێن و برەویان وەرنەگرتووە، لەبەر ئەوەی رێگای زانستی لەهەنگاوەکانی دروستکردنیاندا بەکار ناهێنرێت ئەم جۆرە پەنیرانە جیاوازیان لەزۆر شتدا هەیە وەك هەنگاوەکانی دروستکردنیان و جۆری پێگەیشتنیانRipeningو جۆری

پەنیری دروستکراوو پێکهاتووی کیمیاویو جۆری مەیین و خەسڵەتی هەر جۆرێك لەم پەنیرانەو شتی دیکەش بڵاوترین پێناسە بۆ پەنیر ئەوەیە کە لە کتێبی(پەنیر)دا نووسراوە کەنووسەرەکەی (دێڤینر)ە و ئەمە دەقەکەیەتی:

"پەنیر ئەو مەیوەیەکە لە مەیینی شیری هەندێك ئاژەڵ بە ئەنزایمەکانی (رنین Rennin)وەیا ئەو ئەنزایمانەی کەلەو دەچن دروست دەبێت، بە بوونی ترشی لاکتیك کە ئەویش لەو زیندەوەرە ووردانەی کە خۆمان بەکاری دێنین، دوای لابردنی بەشێك لە ئاوی پەنیرەکە بەهۆی لەتکردنی شیرە مەیبووەکەوە و گەرمکردنی و کردنە ناو قاڵبەکانەوە و پێگەیشتنی بۆ ماوەیەکی دیاری کراو، لە ژێر پلەی گەرماو شێیەکی گونجاودا."

پەنیر گرنگترین بەرهەمی شیرەمەنییەکانە کە ناسراوە، لە هەمووشیان زیاتر بەجیهاندا بڵاوبۆتەوە، جۆرەکانی زۆرن و زۆریشی لێدەخورێت، بەتایبەتی لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا، چونکە بەهای خۆراکی زۆر بەرزەو بەلەزەتیشە بۆ خواردن لەبەر زۆری جۆرەکانی، جگە لە وەی کەنرخیشی گونجاوە.

هەندێك لە وڵاتە پێشکەوتووەکان لە بواری شیرەمەنیدا تایبەتمەندییان لە دروستکردنی هەندێك جۆری پەنیردا هەیە بەرادەیەکی زۆر کەلە پێویستی خۆیان زیاترە و زیادەکەی بۆ وڵاتانی جیهان دەنێرن. بۆ نموونە بەریتانیا ناسراوە بە دروستکردنی پەنیری ووشك وەك چیدەر cheddar و دیربی Derby و شیشر cheshire. فەرەنسا بەناوبانگە بەپەنیری تەڕ وەك کامەمبر camembert و ژیرڤی Gervias . هەرێمە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەناوبانگە بەو پەنیرانەی کەلە شیرێك دروست دەکرێت کە هەموو رۆنەکەی دەرهێنراوە وەك پەنیری کۆتەج cottage. سویسرا بەناوبانگە بەپەنیری ئیمینتاڵ Emmental. وڵاتەکانی ئەسکەنداڤیا ناسراون بەپەنیری میسۆست Mysost کە لەئاوی پەنیر دروست دەکرێت . هۆڵەندە ناسراوە بەهەندێك جۆر لەپەنیری نیمچە ووشك وەك ئیدام Edam و گۆدا Gouda. وڵاتەکانی بەڵقان بەناوبانگن بەو پەنیرانەی کە دەخرێنە ناو خوێواوکەوە Pickled cheese وەك پەنیری فیتا Feta ی یۆنانی. کوردستانی باشوور بەپەنیری پێستە وە بەناوبانگە هەروەها پیشەسازی شیرەمەنی لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا لەریزی یەکەمدایە لەنێوان پیشەسازی خۆراکدا. بەروبوومەکانی شیر لەم وڵاتانەسەرچاوەیەکی گرنگن لە بازرگانیدا. بۆ نموونە (هۆڵەندا) لە ساڵی ١٩٦٧دا (١٣٦٠٠٠)تەن پەنیری فرۆشتووە بە وڵاتانی دەرەوە کە نیوەی کۆی ئەو پەنیرەیە کەلە ساڵێکدا بەرهەمیان هێناوە. هەروەها (نیوزلەندا) یەکێکە لە وڵاتە بەناوبانگەکان بەبەرهەم هێنانی پەنیر، کەلەساڵی ١٩٦٧دا ٨٠٪ بەرهەمی ساڵانەی لەشیرەمەنی فرۆشتووە بەدەرەوە کە نرخەکەی (١٢٠) ملیۆن پاوەنی ئستەرلینی بووە. لەم ساڵانەی دواییدا بازرگانی پەنیر بەشێوەیەکی دیار گەشەی سەندووە بەهۆی زۆری بەرهەمی پەنیرو زیادبوونی داواکارانیو زۆربوونی خەڵکیش. گرنگی پەنیر لە بواری ئابووریدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەم هۆیانە:

١- پەنیر بەباشترین سەرچاوە دادەنرێت بۆ پرۆتینی ئاژەڵی، نرخیشی هەرزانترە لە هەموو سەرچاوەکانی دیکەی پرۆتینی گۆشت بەهەموو جۆرەکانییەوە، جگە لەبەرزی بەهای خۆراکیی.

٢-ئاسانی گواستنەوەو دەستاو دەست کردنیو دابەش کردنیو درێژی ماوەی پاراستنی، هەروەها دەتوانرێت لەسادەترین بارودۆخێکی ژینگەییدا هەڵبگیرێت، بەم جۆرە دەتوانرێت بەدرێژایی ساڵ دابین بکرێت، کەئەمەش سیفەتێکی ئابووری باشە زۆر کەم لە خۆراکەکانی دیکەدا هەیە.

٣-دەرفەتی زۆر هەیە بۆ پەنیر کە بتوانرێت گۆڕانکاری باش لە تام و جۆرەکانیا بکرێت کەزیاتر ئارەزووی کڕیارەکان زیاد بکات بۆ خواردنی ، لەگەڵ خستنە ناو قوتوی جۆراوجۆرەوە لە قەوارەو شێوەدا، کە بگونجێت بۆ کڕین لەلایەن چینە هەژارە کانیشەوە. ئەمانە هەمووی دەبێت بە هۆی مسۆگەرکردنی بەرزبوونەوەی رادەی فرۆشتنیو بازرگانێتی.

٤-پەنیر بەبەرهەمێکی سەرەکی دەژمێررێت لە ناو شیرەمەنییەکاندا، ئێستا گرنگییەکی زۆری هەیە، و خواردنی پەنیر لە جیهاندا زیاد بووە، لە کاتێکدا خواردنی شیرەمەنییەکانی دیکە یا لە جێی خۆی ماوەتەوە یا بەرەو نزمی دەڕوات .

٥-ئامادەکردنی بۆ ژەمەکانی خۆراك ئاسانترە، چونکە پێویست ناکا بە لێنان و ئامادەکردنی پێش خواردنی. هەروەها دەرفەت بۆ بەکارهێنانی لە بوارە جیاوازەکانی لێناندا رێگایەکی نوێیە کە دەکرێتەوە بۆ زیادکردنی بازرگانێتی لە جیهانداو بەکارهێنانی پرۆتینەکەی لەجیاتی پرۆتینی ئاژەڵی لە ژەمە خۆراکە گەرمەکاندا.

٦-پەنیر لە پیشەسازی خۆراکدا بەکار دەهێنرێت، وەك ئیشی هەویرو شیرینەمەنیو فطائر.

٧-پیشەسازی پەنیر رێ دەدات بەوەی کە رادەیەك لەو شیرەی کە لێمان زیادەو ناتوانرێت بفرۆشرێت وەك شیر، بکرێت بەپەنیرو هەڵبگیرێت و لەکاتی کەمی بەرهەم هێنانی شیردا بفرۆشرێت.

٨-پیشەسازی پەنیر سەرچاوەیەکی باشە بۆ دابین کردنی پارەو قازانج بۆ زۆر لە جوتیاران و کرێکارانی شارەزای کارگەکان و کۆمپانیا گەورەکانی شیرەمەنی.

لەم ساڵانەی دواییدا بەرهەم هێنانی پەنیر لەجیهاندا زۆر زیادی کرد، وە سەرژمێرەکانی رێکخراوی(FAO) لەکتێبی ساڵانەیدا ئاماژە دەدات بەوەی کە کۆی پەنیری بەرهەمهێنراو لە (٥,٩٣٤,٠٠٠)ملیۆن تەنەوە لە ساڵی ١٩٦٣ بووە بە(١٣,٣٥٣,٠٠٠)تەن لە ساڵی ١٩٨٤دا.

خشتەی(١-أ)خواردنی پەنیر لە ساڵێکدا بەکیلۆگرام لەو وڵاتانەی کە پەنیر کەم ئەخۆن

| وڵاتەکان | ١٩٧٠ | ١٩٨٠ |
|---|---|---|
| برازیل | ٠,٥ | ١,٥ |
| ئێرلەندا | ٢,٥ | ٣,٣ |
| یابان | ٠,٤ | ٠,٨ |
| باشووری ئەفریقیا | ١,٢ | ١,٣ |
| نیوزیلندا | ٤,٣ | ٨,٩ |
| بەریتانیا | ٥,٤ | ٥,٧ |
| یەکێتی سۆڤیەتی جاران | ٤,٠٠ | ٤,٨ |
| عێراق | ٢,٠٠ | -- |

خشتەی (١-ب)خواردنی پەنیر لە ساڵێکدا بەکیلۆگرام لەو وڵاتانەی کە پەنیر زۆر ئەخۆن

| وڵاتەکان | ١٩٧٠ | ١٩٨٠ |
|---|---|---|
| بلجیکا | ٨,٨ | ١٣,٤ |
| فەرەنسا | ١٤,٠٠ | ١٨,٤ |
| ئەڵمانیا | ٩,٩ | ١٣,٧ |
| ئیتالیا | ١٠,٨ | ١٤,٢ |
| هۆڵەندا | ٨,٤ | ١٣,١ |
| نەرویج | ٨,٨ | ١٢,٤ |
| سویسرا | ١٠,٠٠ | ١٣,٤ |
| U.S.A | ٧,٦ | ١٠,١ |

ئەم دوو خشتەیەو لە کتێبی( تطبیقات في صناعة الجبن) نووسینی R.scoottوەرگێڕانی دکتۆر عامر حمید الدهان و دکتۆر قحطان احمد المزین.(١٩٩٠) وەرگیراوە.

### نرخی خۆراکی پەنیر

پەنیر بەسەرچاوەیەکی گرنگ دادەنرێت بۆ پرۆتینی ئاژەڵی ، چونکە دروستکردنی پشت بە مەیینی بەشە

پرۆتینەکەی ناو شیرەکەوە دەبەستێت بەتایبەتی بەشە کازینەکەی ڕێژەی پرۆتین لە هەندێك لە جۆرەکانی پەنیری ووشکدا دەگاتە ٣٥٪ و بگرە زیاتریش ، وەك پەنیری پارمیزان و گروییر، ئەم ڕێژەیە کەمتر نییە لە ٢٠٪ تەنانەت لە پەنیرە تەڕەکانیشدا کە ناسراون لە جیهاندا. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ڕێژەی پرۆتین لە پەنیردا زیاترە لەو ڕێژەیەی کە لە گۆشتدا هەیە بە هەموو جۆرەکانییەوە.

لەبەر ئەوەی جۆرەکانی پەنیر زۆر زۆرن، وە ئەم جۆرانە جیاوازیان هەیە لە تام بۆن و بەرامەت و بنیات Textureدا، ئەمانە هەموو بوون بە هۆی دابین کردنی پێداویستیو ئارەزووی کڕیارەکان، بۆیە کەسانێکی زۆر ڕوویان کردۆتە پەنیر کڕین و ڕێژەی خواردنی زیاد بووە لە جیهاندا. هەروەها پەنیر دەوڵەمەندە بەچەوری کە سەرچاوەیەکی گرنگە بۆ ووزە وەك لە خشتەی ژمارە (٢)دا دەردەکەوێت. هەروەها نرخی هەرسکردنی زۆر بەرزە، واتە بۆ هەرسکردن ئاسانە بۆ خواردنیش بەتامە، جگە لەوەی کە زۆر دەوڵەمەندە بە کالیسیۆم و مادە کانزاییەکانیتر. وە دەوڵەمەندیشە بەو ڤیتامینانەی کە لەناو چەوریدا تواونەتەوە کە ئەمانەن: A, D, E, Kو هەندێك ڤیتامینی تواوە لە ئاودا وەك ڤیتامین $B_2$.

دەتوانرێت پەنیر بەسەرچاوەیەکی خۆراك دابنرێت کە جێی کەمی خۆراکەکانی دیکە پڕ دەکاتەوە. ڕۆژانە خواردنی پەنیر کارێکی خراپی نییە لەسەر تەندروستی مرۆڤ، بەپێچەوانەوە زۆر خواردنی بەڵگەیە بۆ پێشکەوتنی هوشیاریی تەندروستیو ڕۆشنبیریی کۆمەڵگە. لە سیفاتەکانی پەنیرە کە دەتوانێت پێکهاتووە خۆراکیەکانی بپارێزێت بۆ ماوەیەکی درێژ. لە ولاتە پێشکەوتووەکاندا پەنیر بە خۆراکێکی حەزلێکراو دادەنرێت کە لە ئاهەنگەکان و کۆتایی ژەمە خواردنە سەرەکیەکاندا پێشکەش دەکرێت و خوانەکان بەردەوام پەنیریان لەسەرە.

**خشتەی ژمارە (٢) پێکهاتووە کیمیاوییەکانی هەندێك پەنیری بەناوبانگ لە جیهاندا**

| | گرام لە هەر ١٠٠ گرام پەنیر | | | | کالۆری گەرمایی لە هەر |
|---|---|---|---|---|---|
| | ئاو | پرۆتین | چەوری | شەکرە تاکەکان | ١٠٠گرام پەنیر |
| کاممبر | ٤٧,٥ | ٢٢,٨ | ٢٣,١ | ئاپار | ٢٠٩ |
| چیدەر | ٣٧,٠ | ٢٥,٤ | ٣٤,٥ | ئاپار | ٤٢ |
| شیشر | ٣٦,٤ | ٣٢,٤ | ٣٠,٦ | ئاپار | ٣٨٩ |
| پەنیری قەیماغ | ١٠,٠ | ٣,٣ | ٨٦,٠ | ئاپار | ٨١٣ |
| ئیدام | ٤٣,٧ | ٢٤,٤ | ٢٢,٩ | ئاپار | ٣١٣ |
| گۆرگۆنزۆلا | ٤١,٠ | ٢٥,٤ | ٣١,١ | ئاپار | ٣٩٣ |
| گودا(گەییو) | ٣٤,٩ | ٢٦,٥ | ٣٠,٤ | ئاپار | ٣٩٠ |
| گروییر | ٢١,٩ | ٣٧,٦ | ٣٣,٤ | ئاپار | ٤٦٥ |
| پارمیزان | ٢٨,٠ | ٣٥,١ | ٢٩,٧ | ئاپار | ٤٢٠ |
| پەنیری کولاو | ٤٣,٠ | ٢٣,٠ | ٣٠,١ | ئاپار | ٣٧٤ |

ئەم خشتەیە لە کتێبی-صناعات الالبان-الجبن-الزبد نووسەری حسین طه النجم.(١٩٧٠) وەرگیراوە

**تێبینی:**

١-پەنیر بە هەموو جۆرەکانیەوە بەسەرچاوەیەکی ووزە دەژمێررێن کە بەکیلۆ کالۆری دەدەبڕێن، بەتایبەتی ووشکەکانیان(پەنیری زۆر ووشک، پەنیری ووشك، پەنیری نیمچە ووشك) چونکە ڕێژەیەکی زۆر لە پرۆتین و چەوریان تێدایە.

٢-پەنیری قەیماغ cream cheese جیاوازی هەیە لە نێوان هەموو جۆرەکانی تری پەنیردا کەبەرزییەکی دیار لە کالۆری

گەرمای تیادا یە چونکە ئەم جۆرە پەنیرە لەشیر دروست ناکرێت وەك زۆربەی پەنیری تر بەڵکو لە قەیماغێك دروست دەکرێت کە ڕێژەی چەوری تیادا زۆر بێت.

٣-ماوەی پاراستنی پەنیر پەیوەندی بەڕێژەی ئاوەوە تیایدا هەیە، تا ڕێژەی ئاو کەم بێت لە پەنیردا ماوەی پاراستنی درێژتر دەبێتەوە، بەپێچەوانەشەوە تا ڕێژەی ئاو زۆربێت، زووتر پەنیرەکە تێك دەچێت. هەروەها بەهای خۆراکیی پەنیر بەرز دەبێتەوە بە کەمی ئاو تیایداونزم دەبێتەوە بەزۆری ئاو، بەهای خۆراکیی دەگەڕێتەوە بۆ مادە ڕەقە گشتیەکانTotal solids لەهەر خۆراکێکدا.

٤-مەبەستمان لە (ئاثار) بوونی هەر مادەیەکە بەڕێژەیەکی زۆر زۆر کەم کە بەشێك بیّ لە دە هەزار یا سەد هەزار بەش.

٥-هەر گرامێك لە چەوری کە لەلەشدا دەسوتێت ٩ کیلۆ کالۆریمان دەداتیّ، بەڵام گرامێك لەپرۆتین یا شەکر ٤ کیلۆ کالۆری لە ووزەمان دەداتیّ.

٦-کۆی ئەو ژمارانەی لە خشتەی دوودایە بۆ هەر جۆرە پەنیرێك دەبیّ بگاتە (١٠٠)جیاوازیەکە دەگەڕێتەوە بۆ ڕێژەی خوێی لەو پەنیرانەدا کە باس نەکراوە، لەگەڵ هێندیّ پێکهاتووی دیکە کەبەرێژەیەکی کەم هەن وەك نەیترۆجینە نا پرۆتینەکان NPN و ڤیتامینەکان و شتی دیکەش.

٧-مەبەست لەپەنیری کوڵاوProcessed cheese وە یا پێی دەوترێت پەنیری پاستۆرکراو Pasteurized cheese ئەو پەنیرەیە کە لەشیر دروست ناکرێت، بەڵکو لەچەند جۆرێك پەنیر دروست دەکرێت، پاش لەت کردن و ووردکردن و تێکەڵ کردنیان و گەرم کردنی بۆ پلەی گەرمای بەرز کە دەگاتە ٨٥ °م و هەندێك جار زیاتریش کە دەبێت بەهۆی توانەوەی پەنیرەکە و وەك هەویرێکی شلی لیّ دێت کە بتوانرێت چۆنمان بوێت و بە چ شێوەیەك بیخەینە قاڵبەوە.

**پۆلاندنی پەنیر** Cheese clasification

زۆر ڕێگا بۆ پۆلاندنی پەنیر هەیە، لەوانە رادەی پێگەیشتنی و جۆری زیندەوەرە ووردەکان کە بەشداری لە پرۆسەی پێگەیشتنیدا دەکەن، هەروەها تامی پەنیر لەڕێی زانستی زۆر لەو ترش و ئاوێتە خێرا فرانەی تێیدایەتیو جۆری پەنیرەکەو ئایا مەیینەکەی بەئەنزیمەکانە یا بە پرۆسەی ترشبوونە، لەگەڵ ڕێژەی ئاو لەناو پەنیرەکەدا. بەپێی ڕێژەی ئاو پەنیر دەکرێت بە چوار بەشەوە:

١-زۆر ووشك very hard cheese، ئەم جۆرە لە ٢٥٪ کەمتر ئاوی تێدایە وەك پەنیری پارمیزان، ماوەی پاراستنی چەند ساڵێکە.

٢-ووشك hard cheese، ئەم جۆرە لە ٢٥-٣٦٪ ئاوی تێدایە وەك پەنیری چیدەرو دربی. ماوەی پاراستنی ساڵێکە یا زیاتر.

٣-نیمچە ووشك Semi hard cheese، ئەم پەنیرە لە ٣٦-٤٠٪ ئاوی تێدایە وەك پەنیری ئیدام و پەنیری پێستەی کوردەواریو ماوەی پاراستنی چەند مانگێکە.

٤-تەڕ Soft cheese، ئەم پەنیرە لە ٤٠٪ زیاتر ئاوی تێدایە ، لەوانەشە بگاتە ٦٠٪ وە یا شتێك زیاتریش . وەك پەنیری دمیاطی و ژێرڤیّو پەنیری سپی ئەلبانەکەی بەغدادو پەنیری سەلکی سپی کوردی. ماوەی پاراستنی چەند هەفتەیەکەو هەندێك جار چەند ڕۆژێکە.

**پەنیری پێستە**-Aushari cheese

لەپەنیرە کوردییە نیمچە ووشکەکانەکە لە عێراقدا ناسراوە و تارادەیەکیش لە دەرەوەی وڵاتدا. لە کوردستانی خۆمان دروست دەکرێت، هەندێك جار پێی دەوترێت پەنیری ژاژی، لەسەرچاوە زانستییەکانی زانکۆکانی عێراقدا بە (ئوشاری)ناو دەبرێت. ئەم پەنیرە بۆن و بەرامەتێکی تایبەتی خۆی هەیە، و لە ناو هەموو پەنیرەکانی تری جیهاندا تامی جیاوازی هەیە، زۆریش پەسەندە لەلایەن کڕیارانەوە. ئەم پەنیرە جاران زیاتر لەلایەن ئەو خێڵە کوردانەی کە هاتوچۆ دەکەن دروست دەکرا، جگە لەهەندێك لادێیی کە مەڕو ماڵاتیان هەیەو شارەزاییان هەیە لە دروست کردنیدا ئێستاکە لەبەر ئەوەی ئەم پەنیرە سەر پشکە لەلایەن خەڵکانی کوردستانەوە نرخیشی گرانەو کیلۆی بە (٤٠) دینار دەفرۆشرێت. بۆیە زیاتر لەجاران دروست کردنی بڵاوبۆتەوە لە کوردستاندا. لەناوچەی سلێمانی لەرانیەو قەڵادزێ دروست دەکرێت و بازارێکی فراوانیشی هەیە. لە ناوچەی هەولێردا بەرادەیەکی زۆر لە کۆنەوەتا ئەمڕۆ دروست دەکرێت، تا رادەیەکیش لەناوچەی بادینانیشدا ئەم پەنیرە دروست دەکرێت.

ئەم پەنیرە لەشیری مەڕوبزن ئامادە دەکرێت پاش تێکەڵ کردنی، بەتایبەتی لەوەرزی بەهارا کەشیر زۆر دەبێت.هەنگاوەکانی دروست کردنی جیاوازە لەهەندێك رووەوە لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە، هەروەها بەپێی

